# منداڵانی ئاگر

ئەفسانەیەکی ئەفریکاییە

وەرگێڕانی:
**کەریم مستەفا**


چاپخانەی دەزگای


هەولێر - کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی




زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسیار: بەدران ئەحمەد حەبیب**

***

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، شەقامی گوڵان، هەولێر

# منداڵانی ئاگر

ئەفسانەیەکی ئەفریکاییە

وەرگێڕانی:

**کەریم مستەفا**



ناوی کتێب: منداڵانی ئاگر – ئەفسانەیەکی ئەفریکاییە
نووسینی: ئێنریك ماردێن
وەرگێڕانی بۆ نەرویجی: هێنینگ هاگەروپ
وەرگێڕانی بۆ کوردی: کەریم مستەفا
نیگارکێشانی: فرانی لێساك
بڵاوکراوەی ئاراس – ژمارە: ٧٤٦
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٠٩٣ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ





# منداڵانی ئاگر





زۆر زۆر لەمەوبەر، (نیامە) خواوەندی ئاسمان، بەتەنیا لەو ئاسمانە شین و بەرینەدا دەژیا.

ڕۆژێکیان زەمبیلەیەکی زۆر زۆر گەورەی هێنا و پڕی کرد لە خۆڵ و گژوگیا و درەخت و گوڵ و مێروو و باڵندە و ئاژەڵ و جانەوەر. نیامە، ئەو زەمبیلە گەورەیەی بەتاقی ئاسمانەوە هەڵواسی. زەمبیلەکە گۆی زەوی بوو. نیامە، سەرقاپێکی گەورەی بۆ ئاسمان دروست کردبوو، هەر کاتێك حەزی بکردایە، سەرقاپەکەی لادەدا و دەهاتە سەر زەوی. چەند کونێکیشی کردبووە سەرقاپەکە، تا ڕووناکییان لێوە بێتە دەرێ. سەرقاپەکە مانگ و کونەکانیش ئەستێرە بوون.

ڕۆژێکیان، نیامە، سەرقاپی مانگی لا دا و بەسەرسامییەوە لە جوانیی زەوی ڕوانی. لە قووڵاییی ناخی نیامەدا، دوو ڕۆحی گچکە و گلاراو هەبوون. ئەو دوو ڕۆحە، ئۆقرەیان لێ بڕابوو هەر چاوە چاوی ئەوەیان بوو بزانن نیامە وا بەسەرسامییەوە لە چی دەڕوانێت! هەردووکیان بەگەروویدا هەڵزنان و هاتنە ناو دەمیەوە و لەسەر زمانی دانیشتن و لە درزی ددانەکانەوە، ئەوانیش لە زەوییان دەڕوانی. ئا لەو ساتەدا، نیامە پژمەیەکی زۆر زۆر بەهێز پژمی















ئەو دوو ڕۆحە گچکەیە (ئاسوویا) و (کواکو ئانانسیٚ)
لە دەمی نیامەوە دەرپەڕین و لە سەرقاپەکەی
ئاسمانەوە بەربوونەوە بۆ خواریٚ. پژمەکەی نیامە
ئەوەندە بەهێز بوو، دوو ڕۆحە گچکە وەك بفڕن وابوو،



تا کەوتنە سەر زەوی و لەسەر تەپۆڵکەیەك گیرسانەوە هەستانەوە





سەرپێ و بەدەوری خۆیاندا ڕوانییان.
تەماشای ئەو درەختە بەرزانەی کە نەرمەبا دەیهەژاندن، ئەو گۆمە هێمن و ڕووبارە بەقەڵبەزانەیان دەکرد. لەو نزیکانە ئەشکەوتێکیان دیتەوە، بڕیاریان دا بیکەن بەماڵی خۆیان. هەموو ڕۆژێك دەچوونە دەرەوەی ئەشکەوتەکە و دەگەڕان، بۆ ئەوەی لەگەڵ شنەی بادا گۆرانی بڵێن و لەگەڵ ئەو گەڵایانەی هەڵدەوەرین، سەما بکەن.





ڕۆژێکیان ئاسوویا زۆر هەستی بەتەنیایی دەکرد. لە ماڵ نەچووە دەرێ. کاتێك کواکو ئانانسێ گەڕایەوە ماڵەوە، ئاسوویا، بەخەندەوە بەرەو پیری چوو. کواکو ئانانسێ گوتی: «ئاسوویا، چییە؟ ئەم بەیانییە، کە من چوومە دەرێ، تۆ زۆر بێ تاقەت بووی، بەڵام ئێستا زۆر دڵخۆشیت و وەك گوڵە مێلاقە گەشایتەوە».

ئاسوویا گوتی: «بیرێکم بەخەیاڵدا هاتووە».

کواکو ئانانسێ گوتی: «نا، تکایە واز لە بیر و خەیاڵەکانت بهێنە. دوایەمین جار کە بیرت بەخەیاڵدا هات، ئەو کاتە ئێمە لە ناخی نیامەدا بووین، ئێستاش ببینە لە کوێین!».





لە پێشدا هەندێك قوڕ دەهێنین، پەیکەری لە شێوەی خۆمانی لێ دروست دەکەین، دواتر لەسەر ئاگر دایان دەنێین تا سوور دەبنەوە، کە تەواو سووربوونەوە ئەوجا ژیانیان پێ دەبەخشین. دەتوانین ناویان بنێین منداڵ».

کواکو ئانانیسێ گوتی:

«بەڕاست، ئەوە بیرێکی خراپ نییە!»

بۆ سبەینێ، ئاسوویا، لە نزیك ئەشکەوتەکە هەندێ گڵی هەڵکەند و قوڕێکی گرتەوە. لەولاشەوە ئاگرێکی گەورەیان کردەوە، نێڵەی دەکرد و پزیسکی دەدا.

ئیدی خەریك بوون، چەند بووکە قوڕینەیەکیان لە شێوەی خۆیان دروست کرد و خستیانە سەر ئاگرەکە، بۆ ئەوەی سوور ببنەوە.

لەپڕێکا، گوێیان لە گرمە گرم و تەپە تەپێك بوو، لە ناو دارستانەکەی نزك ئەشکەوتەکەوە دەهات. لە دوورەوە دیتیان وا نیامە، بەرەو لایان دێت. وایان دەزانی کارێکی هەڵەیان کردووە، بەپەلە کەوتنە لابردنی بووکە قورپینەکان لەسەر ئاگرەکە و لە گەڵایانەوە پێچان و لە قوژبنێکی ئەشکەوتەکەدا شاردیانەوە.





هێندەیان زانی، نیامە کەللەی لە دەرکی ئەشکەوتەکەوە هێنایە ژوورەوە و گوتی:

«ئەی ڕۆحە گچکەکانی هاورێم چۆنن؟ ئەو دنیایەتان لە لا خۆشە کە من دروستم کردووە!»

هەردووکیان وەڵامیان دایەوە: «بەڵێ نیامە».

«ئەی ئێوە باش ئاگاتان لێیەتی و دەیپارێزن؟»

«بەڵێ زۆر باش ئاگامان لێیەتی و دەیپارێزین» هەردووکیان وەڵامیان دایەوە.

«دەی زۆر چاکە، باش ئاگاتان لە گشت ئەو شتانە بێت کە من دروستم کردوون.» نیامە ئەمەی گوت و بەگرمە گرم و تەپە تەپ لەو ناوە دوور کەوتنەوە.



ڕۆژی دوایی دیسان، ئاسوویا، چەند منداڵە قوڕینەیەکی تری دروست کرد. هەر هێندەی خستنیە سەر ئاگر، تا سوور ببنەوە، دیسان نیامە پەیدا بووەوە.

ئەمجارەیان، ئاسوویا و کواکو ئانانسیْ، فریا نەکەوتن بووکە قوڕینەکان لەسەر ئاگرەکە لاببەن، ناچار هەردووکیان لە پێش ئاگرەکەدا وەستان تا نیامە نەبینێت چی لەسەر ئاگرەکەیە.

دیسان نیامە کەوتەوە ئامۆژگاریکردنیان. ئەمجارە زۆری قسە کرد، لەوە دەچوو گومانی کردبێت کە ئەو دووانە خەریکی ئەنجامدانی کارێکن! کاتێك نیامە ڕۆیشت، منداڵە قوڕینەکان هێندە لەسەر ئاگرەکە مابوونەوە، بەتەواوی ڕەش هەڵگەڕابوون.






ئیدی بەم شێوەیە، ئەو دووانە هەر خەریکی دروستکردنی منداڵە قوڕینە بوون. چەندانیان دروست کردبوو، لەسەر ئاگر سووریان کردبوونەوە هەر جارێکیش نیامە بهاتایە لایان و زوو فریا بکەوتنایە خێرا بووکە قوڕینەکانیان لەسەر ئاگرەکە لادەبرد و بەگەڵا دایاندەپۆشین، تا نیامە نەیانبینێت. هەر جارێکیش فریا نەکەوتنایە دەبووایە بووکەکان لەسەر ئاگرەکە بمێننەوە تا نیامە دەڕۆیشت. بەڵام بۆ دواجار نیامە لە دەلاقەی مانگەوە بۆ هەمیشە، سەرکەوتەوە بۆ ئاسمانەکەی خۆی!

کاتێك كه ئاسوویا و کواکو ئانانسیێ، گشت منداڵانی ئاگریان بەڕیز دانا و لێیان وردبوونەوه، دیتیان هەندێکیان زۆر کەم سووربوونەتەوه و هێشتا سپین. هەندێکیان کەمێك ئاڵ بوون و هەندێکیش ڕەنگی هەنگوینیان گرتبوو. چەند دانەیەکیان وەك ڕەنگی گوێز وا بوون. هەندێکیشیان



زۆر سوور بووبوونەوه و تەواو ڕەش هەڵگەڕابوون وەك ڕەنگی شەو وا بوون. ئاسوویا و کواکو ئانانسیێ، زۆر دڵیان پێیان خۆش بوو. هەموویان خۆش دەویستن.

ئاخر ئیدی ئەوانه جگەرگۆشەیان بوون!




چەند ساڵێك دواتر، منداڵانی ئاگر گەورە بوون، هەریەکە لە پارچەیەکی ئەم دنیایەدا نیشتەجێ بوون. منداڵیان بوو، منداڵەکانی ئەوانیش منداڵیان بوو. لەبەر ئەمەیە کە جیهان پڕیە لە مرۆڤی هەمەڕەنگ. ڕەش، سپی، سوور، قاوەیی و سوور و سپی. ئاسوویا و کواکو ئانانسیێ، ئێستاش ئەو منداڵانەی خۆیان خۆش دەوێت. هەموویان خۆش دەوێت. هەموویان!.